# إقتران النيرين في مجمع البحرين

دانراوی

خوا لێ خۆش بو

مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابان

ئامادە کردنەو پێش کەش کردنەو لەسەر نووسینی

محمد علی قەرەداغی

بەرگی یەکەم

# إقتران النيرين

## في

# مجمع البحرين

دانراوی

خوا لیّ خۆش بو

مامۆستا مه‌لا ره‌شید به‌گی بابان

ئاماده كردنو پێش كه‌ش كردنو له‌سه‌ر نووسینی

محمّدعلی قه‌ره‌داغی

به‌رگی یه‌كه‌م

له‌سه‌ر ئه‌ركی «حاجی عبدالقادری حاجی عبدالله‌ی جبار»

له‌ چاپ دراوه

اقتران النیرین

فی

مجمع البحرین

محمد قمره داغی

چاپ اول: بهار ۱۳۶۴
چاپخانه حیدری
تیراژ: ۳۰۰۰
ناشر: سقز محمدی



وینەی دانەر لە کاتیکا کە لە تورکیا ژیاوە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين ، وافضـــل الصـــلاة واتم التسليم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه واتباعه الى يوم الدين .

# پێشەکی

کە لاپەڕەکانی مێژوو هەڵ دەدەینەوەو سەرنجێك دەدەینە زنجیرەی گەورە گەوران‌و زانایانی مێژوو ئەبینین هیچ سەردەم‌و جەرخێك نیە چەند زاناو پیاوی گەورەو بەناوبانگی تیا نەبی ، کە هەریەکە لەسەردەمی خۆیانا لە ڕوویەکەوە یا لەچەن ڕوویەکەوە خزمەتیان بە ئایین‌و ولات کردووە ، وە دەستی بالایان لە پەرەپێدان‌و پێش‌خستنی زانیاریە جۆراو جۆرەکانا بووە •

کاتێکیش لەناو ئەو گەورەو زانایانەدا لە زنجیرەکانیانا چاو بو ناوی زاناو گەورەکانی کورد بگێڕین ئەبینین لە لاپەڕەکانی مێژوودا ، وە لە ناو زنجیرەی زانایاندا جێگەی زانایانی کورد بە چولی نەماوەتەوە ، بەلکە بەزوری وە لەریزەکانی پێشەوەدا جێگەی دیاری‌و ناوی بەرزیان هەیەو هیچ دەمێك دوا نەکەوتوون لەکۆڕی زانیاری‌و گەشەپێدانی زانیاریەکان • هەمیشە دانراوو نووسینی بەنرخ‌و بەکەڵکیان بووەو بەهەموو توانایان خزمەتی ئاینی پاکی ئیسلامیان کردووە •

زیاد لەوەیش کە صەدەها زاناو پیاوی بەرز لەوانە کە ناویان نازانری ، یا ـ لەبەر هەرهۆیەك ـ ناوی ئەوەیان لێ سڕراوەتەوە کە پەیوەندیان بەگەلی کوردو زمانی کوردی‌یەوە هەیە ، لە هەمان‌کاتیشا ئەو زانایانە لەکوردوستانا بوون ، وە زمانیان کوردی بووە لەبنەماڵەکانی کوردوستان پەیدابوون •

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە هیچ سەردەمێك خاڵی نەبووە لە زانایانی کوردو وە لەهەمان‌کاتا ئەو زانایانە دەوری باڵایان لە ناو کۆمەڵانی گەلا بووە ، وە بایەخی تەواو هەر بە ڕاو قسەی ئەوان دراوە ، وە لە توانایانا بووە کە بەگەلی جوز ، لە ریگەی زمانی کوردی‌یەوە خزمەت بە

ئایین بکەن‌و ئاینی پاکی ئیسلام بو خەلق روون بکەنەوەو نووسراوی بە نرخ لە پاش خویان بەجی‌بیلن • بەلام ــ بــە داخەوە ــ خزمەتیان بــە زمانی کوردی لە سنوورێکی تەسکا بووە ، زیاد لــەوە کە بــە زمانی کوردی دەرسیان بە قوتابیان وتووە شتێکی تری بایەخــداری دیاری‌یان نەبووە •

هــەر ئەمەشە بووە بــە هوی ئــەوە کە گەلیك لــەو زانایانە پاش خۆیان ناویان کوێر بوەتەوە ، یا سەپێنراون بەسەر گەلێ ولاتێکی ترا کە پەیوەندیان ــ لە ڕاستیا ــ لە گەڵیانا نیە ، وە جگە لەوە کە ڕەنگە لەو جێگایانەدا سەردەمێك یان بە خوێندن یا بەدەرس‌وتنەوە ژیاون ، وە هەندێکیان لــەویا کۆچی دواییان کردووەو سپێرراون بــە خاك • زیاد لەمانە هیچ پەیوەندی‌یەك نیە کەبیان‌کا بە خەڵقی ئەو ولاتانە •

بەم شێوە تا ئەم‌سەردەمەی دوایی نووسین لە ناوچەکانی کوردوستانا هــەر بەعەرەبی‌و فارسی بووە ، بۆ ماوەیەکیش نووسینی فەرمانبەران‌و فەرمانەکانی‌میری بە تورکی بووە لە ناوچەکانی کوردوستانا • ئەمــانە هەمووی بوەتە هۆی دواکەوتنی نووسین بە زمانی کوردی لە ناو گەلی کوردا •

بەڵام وە نەبێ کــە ئەم هۆیانە کارێکی تەواویان کردبێتە ســەر مامۆستایان‌و نووسەران‌و بووبن بەکۆسپ لە ڕێگەی نووسینیانا بە زمانی نەتەوەکەیان • بەڵکو زۆریان دڵیان لێی داوە بۆ ئەوە کە بە کوردی بنووسن وەهەڵبەست‌و وتاریان بە کوردی بێ هەرچەندە کە گەلێکیش لە خوێندەواران بەربەرەکانی ئەم هەستانەیان کردووە بە تەشەرو توانج بۆ خاوەن هەستەکان •

وە کاتیك لایەك بکەینەوە بەلای ئەوانەدا کە بە کوردی نووسیویانە

وه ویستوویانه کوردی نووسین بلاوبێتەوه به ناو خوێندەوارانا ئەبینین ئــەم هەستە لای کەسانێك ــ بــه زۆری ــ پەرەی سەندووه که بۆیان ریك کەوتووه له سنووری کوردوستان بچنه دەرێو لــه گەلی بارەوه چاویان بەسەر پێش‌کەوتنی گەلانی جیهانا دڕیوەتەوه ؛ وەکو زانیاریو پیشەسازیو ... هتد .

له هەمان‌کاتیشا له پێش‌چاویان بووه که گەلەکەیان تا چ ڕادەیەك له گەلانی جیهان دواکەوتووه له هەمەموو بارەیەکەوه . ئەو کاته بیریان لەم دواکەتنه کردوەتەوەو گەڕاون بۆ چارەسەرکردنی هەرکەسی بــه گوێرەی توانا .

ماموستا مەلا رەشید بەگی بابان یەکیکە لەو زانا بەرزانه که لــه سەردەمیکی کونەوه ویستوویەتی له ریگەی ئاینی پاکی ئیسلامەوه خزمەت به گەلو زمانی کوردی بکا ، ئەمەش له کاتێکا که له تورکیا ژیاوه بۆ ماوەیەك بــه فەرمانبەری ، کاتێك کــه تەمەنی گەورەبووه وه لی خراوه بیری کردوەتەوه که خزمەتیك بکا به گەلەکەی که پاش خوی بمینیتەوه و سوودی لێ وەربگیرێ .

جا بۆ ئەم مەبەسته گرنگه هــاتووه هــەموو حەدیثەکانی پێغەمەر ــ دروودی خوای لەسەربێ ــ که وان له دوو کتێبەکەی « مسلم » و « بخاری » دا کوی کردوونەتەوه ، وه هەرچی حەدیثێك که دووپات کرابێتەوه لای بردووه ، ئەمجا ڕێکی خستوون و تەرجەمەی کردوور به کوردی وه ناوی ناوه به « اقتران النيرين في مجمع البحرين » .

ئەم کتێبه بــه ڕاستی کتێبێکی زۆر به نرخو به کەڵکه بۆ هەموو خوێندەوارێکی کورد له بەر ئەم هۆیانه :

۱ ــ ئەم کتێبه تاکه لەم بابەتەدا ، وه تا ئیسته هیچ کەسێك کارێکی

وای نەکردووە کە فەرمایشتەکانی پێغـەمبەر ـ د ـ ئاوا بە گشتی کۆ بکاتەوە وە مانایان لێك بداتەوە وەبیان خاتە پێش دەمی موسوڵمانانی کورد • واتە ئەم کارە کارێکی گەلێ بەنرخو گەورەیە بۆموسوڵمانانی کوردو ئەتوانن ـ بەهووی ئـەم کتێبەوە ـ لـەماناو مەبەستی فـەرمایشتەکانی پێغەمبەر ـ د ـ تێ بگەنو ڕوونی بکەنەوە بۆ موسوڵمانان •

٢ ـ ئـەم کتێـبە بۆشایی‌یەکی فراوان لـە کتێبخانەی کوردی‌دا پڕئەکاتەوە کـە دەمێکە چاوەڕوانی پڕکردنەوەیە ؛ چونکـە ـ وەکو وتمان ـ تا ئێستە کارێکی وا نەکراوە کە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ـ د ـ بە تێکڕایی کۆبکرێتـەوەو مانایان لێك بدرێتەوە بـە زمـانی کوردی • ئاشکرایە کە هەر خوێندەوارێکی کورد بیەوێ لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ـ د ـ تێ بگەیێ ، یان لەباسێك بکۆڵێتەوە پێویستی بە سەرچاوەیەك کە بە زمانەکەی خۆی بێ هەیە لەو بارەیەوە تا بە ئاسانی بتوانی مەبەستەکەی حوی بە دەستبهێنی ، وە لە هەوڵو باسەکەیا بە هەڵەدا نەچێت •

٣ ـ کاتێك بمانەوێ بەراوردێك بکەین لە نێوان جیاوازی زمانی کوردی‌دا لەمسەردەمە یا لە هەرسەردەمێ ترا لە گەڵ ئەو کاتەدا کـە ئـەم کتێبەی تیـا نووسراوەتەوە ئەبینین ئەم کتێبە چاکترین سەرچاوەو بەڵگەیەکە بۆ ئـەو مەسەلەو ئاوێنەیەکی ڕاستی‌یـە بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی زمانی کوردی لەو سەردەمەدا •

زیاد لەوە کە ئـەم کتێبە لەوانەیە ببێ بـە سەرچاوەیەکی گەلێ بەکەڵك لە بارەی زۆر لەوشەی کوردی‌یەوە کە دانەری ئەم کتیبە بە کاری هێناون لە کاتی مانا لێدانەوەیا بۆ فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ـ د ـ •

٤ ـ ئـەم کتێبە چاکترین بەڵگەیەکە بۆ ناسینو لەبیرنەچوونەوەی زانایەکی بەرزی وەکو « مامۆستا مەلا ڕەشید بەگ » کە هەمیشە لەهەوڵی

پێش‌کەوتنی گەلەکەیا بووە ، وە هەموو کات هیوای ئەوەبووە کە خوێندن‌و خوێندەواری لە کوردوستانا لە پەرەسەندن‌و گەشەکردنا بێ •
ئەو زانایەی کە گەلی کورد زۆری وای بووە بەڵام پاش خۆیان ناویان کوێر بوەتەوەو لەبەر نەبوونی کتێب‌و نوسینیان بە زمانی کوردی چوونەتە رزی نەبووان ••

دانەری ئەم‌کتێبە لە کاتێکی زور ناسکدا ، وەلە جێگایەکدا کە گفتوگۆ بە زمانی کوردی قەدەغە بووە – چ جای « تألیف » کتێب دانان بەو زمانە وە بلاوکردنەوەی ئەقافەتی – • دانەر لەو کاتە ناسکەدا ئەم‌کارە گرنگەی کردووە ، وە ئەوەندە لە مەترسیدا بووە لە کاتی دانانی کتێبەکەدا کە بە هیچ شێوەیەك نەیتوانیوە کە – نص – سایە کوردی‌یەکە کە ڕونووسێکی کردووە لای خۆی بێ‌هێڵێتەوە ، بەڵکو هەر بە تەواوکردنی هەرباسێك لە باسەکانی بێ وەستان ڕەوانەی کردوەتەوە بۆ سلێمانی کە مەترسی لەفەوتانی کتێبەکە لەوێدا کەمتر بووە • وەکو ئەمە ڕوونە لە گەلێ جێگەی کتێبەکەدا ••
ئەم کتێبە لە کاتێکەوە کە دانراوە تا ئیستە لە سلێمانی ماوەتەوە لەلای « ماموستامەلا حسینی پیسکەندی » وە لە دوای خۆی لای « ماموستا مەلا سەلامی کوڕی » • وە تا ئیستە « حاجی عبدالقادری جبار » یەك دوو جار هەولی داوە بو چاپ‌کردن‌و بلاوکردنەوەی بەلام تیا سەرنەکەوتووە نە بەر ئەوە کە پیویستی بە ئەرکیکی زور هەیە لە پاك‌نووس کردن‌و سەرپەرشتی چاپ‌کردنی • وە بۆ دوا جار هاتەوە سەر ئەوە کە چاپی بکا وە داوای لە ماموستا مەلا سەلام کرد کە بینێرێ بۆی بۆ بەغدا •

بۆ ئەم مەبەستە پەنای هێنایە لای « ماموستا مەلا عبدالکریمی مدرس » کە یارمەتی بدات بۆ نووسینەوەو سەرپەرشتی کردنی •

ماموستایش لە بەر ئەوەی کەئەم کارە پیویستی بە کاتیکی زور

هەیە ، وە ئەرکێکی گرانە ، وە ئەویش ئەو کاتەی نیە تەکلیفی لێ کردم کە ئەم فرمانە جێ بەجێ بکەم • منیش گەلێ سەرپێچیم کردو هەولمدا کە ئــەم کارە نەگرمە ئەستوم ؛ چونکــە پیویستیەکی زوری هەیە بــە زانیاریو شارەزاییەکی زۆر کە من هیچێك لەوانەم لە خۆما نەئەدی •

بەڵام مامۆستا هەر ماوەی سەرپێچی نەدام وە گەلێ هانی دام بۆ ئەوەی ئەم کارە بە ئەنجام بهێنم ، وە ئەویش یارمەتیم بدات لە هــەر جۆرە کۆسپێکا کە بێتە ڕێگام وە پێویستی بە یارمەتی بێ •

جا منیش کاتێك کە ئەو هەموو هاندانەی مامۆستام دی ـ پشت بە خوا ـ بڕیارم دا کە دەستی پێ بکەم ، ئەم خزمەتە بکەم بە فەرمایشتە جوانەکانی پێغەمبەر ـ د ـ کە بەڕاستی هەموو وەکو مەشخەڵی ڕێگەی ڕووناکین بۆ کەسانێك کە بیانەوێ لــە تاریکی کوفرو گومڕایی لادەنو ڕێگەی پاکی خوا پەرستی بگرن •

وە لە کاتێکا بڕیارم دا دەس کەم بە نووسینەوەو ئامادەکردنی بۆ چاپ هەندێ کەس ـ لــە بەرئەوەی کە کتێبەکە وشەی عەرەبی زۆر تیایە ، وە جیاوازی هەیە لــە گەڵ نووسینی ئیستادا ـ ڕایان وابو کــە دەس کاری ئەو وشانە بکەم ، وەبیان گورمە سەر کوردی •

بــەڵام گەلێ کەسی تر ڕایان وابو کــە بەهیچ جۆر دەس کاری نەکری وە چونی داناوە هــەروا بلاوبکریتەوە ، وە هــەرئەم رایەش راستە ، وە ئــەبی گوێی لی بگیری ؛ چونکــە هەرجورە دەس کاری کردنێك لــەم کتێبەدا بکرێ بــە کەمکردنەوەی نرخی کتێبەکە تــەواو ئەبێ • زیاد لەوە کە خیانەتێکی گەورەیە لەو دانراوە • وە ئــەو کاتە ئەو کتێبە لەوە ئەچێتە دەرێ کە کتێبی ئەو دانەرەی پێشوبێو کتێبی ئەو سەردەمە بێ • وە ئیستە پێویست ئەوەیە کە کتێبەکە بە تەواوی بلاو بێتەوەو دەس خویندەواران بکەوی ئەوسا خویندەواران لە زور یگاوە

ئەتوانن کەلکی لی وەربگرن ؛ وەك ئەبینین کتیبی « بخاری » کاتی خوی بە تەواوی نووسراوەتەوەو چاپ کراوە لە پاشان چەند جار دەس‌کاری کراوە و کورت کراوتەوە[1] دەس‌بژیری تیا کراوە وەکو « جواهر البخاری » و کتیبی تری لێ دەرهێنراوە •

جا خوێندەوارانی کوردیش ئەتوانن پاش بلاوبوونەوەی ئەم کتێبە بەگەلێ شێوە کـەڵکی لێ‌وەربگرن‌و گەلێ جورێ لێ دەربهێنن ؛ وەك ئامۆژگاری و چیرۆك‌و ئەخلاق‌و ••• هتد •

کاتێك ئەم قسەیەم گرتەگوێ ، وە بڕیارمدا کە دەست بکەم بە نووسینەوەی کتێبەکە بەم شێوەیە دەستم پێ کرد :

أ ـ ئـەو ئیملایەی کـە ماموستا مەلا رەشید بەگ پێی نووسیوە ـ بە گوێرەی توانا ـ بیگۆڕمە سەر ئیملای کوردی ئیستە ؛ چونکـە ماموستا مەلا رەشید بەگ لەم دانراوە بە نرخەیدا ـ وەکو لەمەولا باسی لی ئەکەین ـ ریگەیەکی تایبەتی گرتوەو ، یاسایەکی سەر بـە خوی داناوە بو نووسینەوەی کوردی کە پاش خوی بلاو نەبووەتەوە ئیستاش نووسین لە سەر ئەو شێوەی ئەوە ـ بە تایبەتی بۆ چاپ ـ کارێکی ئاسان نیـە •

ب ـ بە زوری « اعلام » ناوەکان هەر بەشیوەی عەرەبی بهیلمەوەو لەسـەر ئیملای عەرەبی بیان نووسم •

ج ـ لـە هەندی جیگەدا کە زور بە پیویستی بزانم بو روون‌ـ کردنەوەی جێگاکە لە دامێنەوە شتێکی لەسەر بنووسم •

---

(١) مەبەست لە کورت‌کردنەوە کورت‌کردنەوەی حەدیثەکان نیە ، بەلکو مەبـەست کەم‌کردنەوەی باسـەکان‌و ژمارەی حەدیثەکانیـانە • م• ع• ق•

د ـ ئەو ڕەمزو ئیشارەتانەی کە دانەر دایناونو گۆڕینیان مایەی زیانە بە نووسراوەکە هەروەکو خۆی بی هێلمەوە ؛ وەکو لەهەر جێگەیەکدا ئەم دوو هێڵە بو [ ] مانای وایە ئەوەی کە لەناویا نووسراوە دانەر یان خۆی وتوویە یان بە زیادە لەجێگەیەکی ترەوە هێناویەتی •

هـ ـ لەبەر ئەوەی کەئەم کارەی من « تحقیق » نیە ، وە کتێبەکەش دەس‌نووسی دانەر خۆیەتی هەر بە نووسینەکەی خۆی « اکتفام » کردووە وە نەگەڕاومەتەوە بۆ سەرچاوەکانی • مەگەر لە جێگەیەکدا کەوتبێتمە شکەوە ، یان بۆم دەر کەوتبێ کە دانەر بەهەڵەدا چووەو هیچ‌کەس لە هەڵە بەری نیە ، ئەو کاتە لەدامێنەوە ئیشارەم کردووە بۆلای راستی جێگەکە ••

لە کۆتاییدا داوا لە هەموو خوێندەواران ئەکەم کە هەر پێش‌نیارو ڕەخنەیەکیان هەبێ دەری ببڕن تا بتوانرێ بە باشترین شێوە ـ پشت بە خوا ـ بەرگەکانی تری ئەم کتیبە پیش‌کەش بە خویندەوارانی کورد بکرێ •

**محمدعلی قەرەداغی**

**بەغدا کەرخ مزگەوتی قومرییە**

**٨ـ٩ـ١٩٧٣**

# دانەر لە چەند دێڕیکا[1]

## ناوی‌و بنەماڵەی :

ئەم زانا پایە بەرزە ناوی مەلا محمد ڕەشید بەگی کوڕی فتاح‌بەگی ، کوڕی محمدبەگی ، کوڕی خالدبەگی کوڕی محمدپاشای ـ مەشهوور بە خانەزێرینە ـ ، کوڕی خالدخان‌پاشای ، کوڕی احمـد پاشای ، کوڕی میرسلێمانی کوڕی فەقی‌احمدی دارەشمانەیی[2] کوڕی کاکە میرە ٠

## لە دایك‌بوونی :

گەلێك گەڕام‌و هەوڵمدا بۆ ئەوەی شتێکی ڕاست بدۆزمەوە لەبارەی جێگەو مێژووی لە دایك‌بوونیەوە بەلام لەو بارەوە هیچم بەدەس نەهینا ٠

ئەوەندە هەیە ئەتوانین مێژووی لەدایك‌بوونی لە قسەیەکی خۆیەوە وەربگرین کە لە پێشەکی کتیبەکەیا ئەیکا ، ئەوەش ئەوەیە کە ئەلی : « لە دوای حەمدو صەلات‌و سەلام : ئەم عەبدە گوناهکارو زەلیل و بێ چارەیە دەلێ : کە عومرم لە حەفتاساڵ تێ پەڕیوە ٠٠٠٠٠٠ » لەمەش ڕوونتر لە « وەصیەت نامە » کەیادەلی : « لە عومری حەفتاودوو سالیما ئەم بارە قورصەم هەڵگرت ٠٠٠٠٠٠ » ٠

کاتی دەسی‌پێ‌کردنی کتێبەکەشی ساڵی ١٩٤٠ بووە واتە ئەتوانین بلێین : لەساڵی ١٢٨٧ی کۆچی دا لەدایك‌بووە ٠

## ژیان‌و خوێندنی :

---

(١) زوری ئەم باسەم لەدەس خەتەکەی « یادی مەردان »ی ماموستا « مەلا عبدالکریمی مدرس » بەرگی : ٣ ٠ لاپەڕە : ٥٢٩ وەرگرتووە ٠٠

(٢) دارە شمانە : دێیەکە لە ناوچەی « پشدەر » ٠

ئەم مامۆستا بەرزە خوێندنو سەرەتای زیانی هەر لە کوردوستانا بووە ، نەبیسراوە کە ـ پێش چوونی یەکجاری بۆ « ئەستەمووڵ » ـ کوردوستانی بەجێ هیشتبێ . پاش ئەوەی ، لەسەر یاسای ئەوسا ، قورئانی پیرۆزو کتێبە وردەکانی خوێندووە بۆ تەواوکردنی خوێندن چوەتە لای ماموستای بە ناوبانگ « ماموستا مەلا ئەورەحمانی پنجوینی »[1] لای ئەو خویندنی تەواوکردووەو « ئیجازە »ی دەرس وتنەوەی لای ئەو وەرگرتووە .

پاشی ئەوە « مامۆستا مەلاحمە امینی » برای مامۆستای پێنجوێنی کچی خۆی داوەتێ ، وە ئەوکچە ناوی « ڕەزێ خان » بووە ..

لە پاشان هاتوەتە سلێمانیو لە مزگەوتی « شێخ سەلام » بووە بە مامۆستای ئەو مزگەوتەو دەرسی فەقێی وتوەتەوە .

وا دەرئەکەوێ ئەم مامۆستا بەرزە هەر لە سەرەتاوە پلەیەکی خویندەواری بەرزی بووەو لە زانیاریە ئاینیەکانا گەلی پیش کەوتو بووە . هەر ئەوەش بووە کە مامۆستای پێنجوێنی وا لێ بکا کە کوڕی خۆی بنێرێ بۆ لای بۆ مزگەوتی « شێخ سەلام » بۆ ئەوەی لای

---

(١) ئەم مامۆستایە کوڕی مەلامحمدی شێخەڵ مارێنی کوڕی مەلا ابراهیمە ، لە نەوەی « سید نورالدینی بریفکانی »یە . مامۆستایەکی پایە بەرزو ناودارە بۆخوێندن گەلێ جێگا گەڕاوە وەکو بغدادو سنەو ... جێگای‌تر . حاشیەو تەعلیقاتی زۆری هەیە بەسەر زۆر لەکتێبە ئایینیو زانیاریەکانەوە ، گەلێ « فتاوی »ی هەیە زۆری لە « جواهر الفتاوی »ی مامۆستا « ملا عبدالکریمی مدرس »دا چاپ کراوە ، لە هەموو لایەکەوە فەقێ ـ کوردو غەیری کورد ـ سوودیان لێ وەرگرتووە لە پێنجوێنا لەشەویك لە شەوە جومعەکانی مانگی « ذی القعدە »ی سالی ١٣١٩ کوچیدا لە جیهان دەرچووە ، لە مزگەوتی « عثمان پاشا » بە خاك سپێرراوە ..

بخوێنی ، بەڵام ئەم کوڕەی مامۆستای پێنجوێنی جوانەمەرگ بووە ، وە خوێندنی تەواو نەکردووە •

پاش ئەوەی کە ماوەیەك ماوەتەوە لە مزگەوتی شێخ سەلام کراوە بــە ماموستای فیرگە « مدرسە » ی « روشــدیەی عەســکەری » لـــە سلیمانی • وە لەو فیرگەیەدا دەرسی وتوەتەوە تا سالی ١٩١٢ ز ـ وە لە ســاڵی ١٩١٢ز ـ دا • واتــە دوو ســاڵ پێش شــەڕی جیهــانی یەکــەم کوردوستانی بەجێ هێلاوە ، وە چووە بو ئەستەموول‌و لەوێ ماوەتەوە بــە فەرمانی دادیاری « موحامیــتی » ، تا لــە نزیکی ١٩٣٥ خانەنشین کراوە[١] •

## کۆچی دوایی :

هەر کاتێك کە باسی کۆچی دوایی ئەم مامۆستا بەرزە بکرێ لە گەڵ « مجمع البحرین »ەکەیا نەبێ باس ناکرێ ؛ هۆی ئەوەش ئەوەیە کە پاش گەورە بوونی تەمەنی‌و خانەنشین کردنی‌و پێش کۆچی دوایی دەستی کردووە بە دانانی ئەم کتێبە ، وە وەکو خوا درێژەی دابێ بــە تەمەنی بۆ تەواو کردنی ئــەم کتێبە وایە ؛ چونکە دوای تەواوکردنی کتێبەکەی بــە ٤٣ ڕۆژ لە ڕۆژی هەینی ١٣ی مارتی ١٩٤٢ی زاینی ، ڕێکەوتی ٢٥ی سەفەری ١٣٦١ کۆچی‌دا کۆچی دوایی کردووە‌و لــە ئەستەموول بەخاك سپێرراوە •

## بلیمەتی‌و زیرەکی‌ی :

ئــەم ماموستایە ماموستایەکی زور زیرەك‌و بلیمــەت بووە ، وە

(١) لە پیشەکی یەکەیدا ، واتە لە سالی ١٩٤٠ دائەلی : « پینج شەش سالیکە تەقاعود کراوم » ؛ بویە منیش ئەم شیوەم بەکارهینا لە دیاری‌کردنی سالی خانە نشین کردنیا •

یەکێك بووە لەو زانا بەرزانەی کە بەهرەمەندیو تەوانایەکی گەورەیان بووە لـە گـەلێ بارەوە • بەڵگەی بلیمەتی ئـەم مامۆسـتایە نووسـینو کتێبەکانیەتی کە لەپاش بەجێ ماوون ، کاتێك سەرنجێك بدەینـە دەس نووسەکەی « مجمع البحرین »ی ئەبینین ئـەم مامۆستایە کاتێك کە لـە ئەسـتەمووڵ ژیاوەو ئاگاداری کوردوسـتانو نووسین لـە کوردوسـتانا نـەبووە ، وە دەستی کردووە بـە دانانی کتێبەکەی لەوکاتەدا ئیملای کوردی شێوەیـەکی دامەزراوی نەبووە ، وەهەرچی بووبێ هەربریتی بووە لە هەوڵو تەقالای چەند خوێندەوارێکی کورد بۆ چارەسەرکردنی ئیملای کوردی کەئەوەش مامۆستا مەلا ڕەشید بەگ لێی بێ‌ئاگا بووە • جا ئەو هەر لە خۆیەوە یاسایەکی تایبەتی داناوە ، کە ئەو یاساو شێوەیە هەرهی خوی بووەو ، وە ئەپیش ئەو وەنە لەپاش ئەو کەس بەکاری نەهێناوە • کـە ئەمە بەڵگەیەکی گەورەیە بۆ زیرەکیو بلیمەتی ئـەو زانایە • لەوەش گرنگتر ئەوەیە کـە توانیویەتی لە کتێبێکی « ٢٨٠٠ » لاپەڕەیا پەیڕەوی ئەم یاسایەی خۆی بکا کە بۆ یەکەم جار دایناوەو لە دانانی ئەو کتێبە بێتەوە ، کە وەختە بڵێم گەورەترین کتێبێکە تا ئیستە بـە کوردی دانرابێ ؟ چونکە هـەموو کتێبەکە هەشـت تادە بـەرگی گەورەئەبێ ، وە ئـەم کارەی لـە ماوەی « ٢٢ » مانگا بە ئەنجام هیناوە لە گەڵ ئەو هەموو وردەکاری‌یەدا کە کردوویە[١] •

## پەیوەندی لەگەل ولاتو هاوە لانی :

کە ئـەم زانا بەرزە سلێمانی بەجێ هێڵاوەو چوەتە ئەستەمووڵ ، وەنەبێ ئیتر سلیمانی لەبیر چووبێتەوە وە دانکەنی هاوەلو برادەرانی

---

(١) بۆ زیادەئاگاداری لە « یاسا ئیملای‌یەکەی دانەر » بڕوانە ژمارە هەشتی گۆڤاری « نووسەری کورد » ••

بووبی ، بەلکو هەمیشە ئەو هاوەلانەی لە بیر نەچوەتەوە بە تایبەتی ئەو مامۆستایانەی کــە لــە گەلّیان ژیاوە ، وە هاوفــەقێی بوون ، ئەگەر سەرنجێك بدەینە هەندێ لەو نامانەی کە لە ئەستەموولەوە ناردوونی بۆ سلێمانی بە ئاشکرا ئەم ڕاستیەمان بۆ دەرەکەوێ ، هەر وەکو بۆیشمان دەرئەکەوی کە چەند دلسوز بووە بە هاوەلانو نیشتمانەکەی •

لە یەکێك لەنامەکانیا کە بو « ماموستا مەلا حسینی[1] پیسکەندی » ناردووە پاش سەلاوو هەوال پرسین ئەلی : « •••• ئیرتیحالی باباعلی ـ غفر الله له ـ مووجیبی ئەسەفێکی زۆربو بۆمان • خوا مەلاکانی تر ، پیرو جوانیان ، سەلامەت بکا ژۆریان بکاو تەوفیقیان‌بدا لەسەر نەشری علم ••• » لە جێگەیەکی کەی ئەم نامەیەدا ئەڵی : « ••• چاوی مەلا سەلام ماچ ئەکەم خوا سەلامەتی بکاو تەوفیقی بدا » !

شێخ نوری باباعلی چۆنە واهەیە کە جێی باوکی بگرێتەوە ؟ شێخ جلال چۆنە ، مەلا سعید چۆنە ، مەلای تازە پێ‌گەیبون یانە ؟ لوطفەن بوم بنووسە !! » •

بەلّام لە ناو ئەو هاو مامۆستاو هاوەلّانەیدا پەیوەندی‌یەکی جیاوازی تایبەتی لە گەلّ مامۆستا مەلا حسینی پیسکەندیدا بووە ، ئەو پەیوەندی‌یەی

---

(١) مامۆستا مەلا حسین کوڕی فتح‌اللەی ، کوڕی حاجی خەلیفــە پیرۆتە ، زانایەکی پایەبەرزو ، خواناسێکی گەورە بووە ، یەکێکە لە فەقێ چاکەکانی مامۆستای « پینجوێنی » هاوفەقێی مامۆستا مەلا ڕەشید بەگ بووە ، بــە یەکەوە لای مامۆســتای پێنجوێنی ئیجــازەیان وەرگرتووە ، یەکەهاوەلّی گیانی مامۆستا مەلا ڕەشید بەگ بووە •

سالّی لە دایك بوونی یم بۆ ڕوون نەبوەوە ، لــە ڕۆژی جومعەی ڕێکەوتی یەکی تشرینی یەکەمی ســالّی ١٩٤٨ ز ، بــەرانبەری ٢٨ / « ذی القعدە »ی ١٣٦٧ ك ، لە جیهان دەرچووە ••

که لەگەل ئەوا بوویەتی زور کەم ریئەکەوی کە پەیوەندی نیوان برایانی دایکو باوکیش وابی ؟ وەکو ئەمەش ئاشکرایە لە دانانو نووسینەوەی « مجمع البحرين »ە کەیدا ، وەکو ئەبینین کە بەپرسو رای ماموستا مەلا حسین نەبێ هیچی نەکردووە تەنانەت پرسی پێ کردووە بۆ ناوی کتێبەکە ، وە بۆ رۆژێ کە تیا دەسبکا بەدانانی ، وە هەروەها لە گەڵ ئەوەدا کە فورمە بەفورمە لە تورکیاوە بە پوستەدا بوی ناردووە لە زور جێگەدا ئەلی : هەرچیت بەدل نەبو یابەلاتەوە باش نەبو دەسکاری بکەو بیگۆرە • وە پاشی لێبوونەوەی لە کتێبەکە « وەصیەت نامە » یەکی نووسیوە بۆ مامۆستا مەلا حسینو مامۆستا مەلا سەلامی کوری ، وە لەدوای ئەم « چەن دێرەوە » لە جێگەیەکی ترا ئەیبینی •

## دانراوەکانی :

دانەری ئەم کتێبە زانایەکی بەرزو بەهرەمەند بووەو لە گەلێ لە زانیاریەکانا دەستی بالای بووەو توانایەکی باشی لە نووسینو دانانی کتێبا بووە • لە گەڵ ئەوەشا کە ژیانی بەفەرمانبەری بردوەتەسەرو ماوەی بەتالی کەمبووە گەلی نووسراوی بەکەلکی لە پاش خوی بەجی هیشتووە ئەمانە هەندێکن لە دانراوەکانی ئەم زانا پایە بەرزە :

**١ ـ اقتران النيرين في مجمع البحرين :**

ئەم کتێبە ـ وەکو لەسەرەتاشەوە باسمان لی کرد ـ گەورەترین کتێبێکە بە زمانی کوردی نووسرابێو هەواڵی بزانین •

**٢ ـ درر النضيدة في شرح منظومة الفريدة(١) :**

لەکۆتایی کتێبەکەدا نووسیویە : « وبعد : فهذا غاية ما املیناه ، ونهاية

---

(١) ناوی ئەم کتێبەو هەندی شتی ترم لە مامۆستا مەلا سلام وەرگرت •

ما املناه في هذا الشرح في يوم الجمعة قبيلها تاسع عشر شعبان المعظم سنة الف وثلثمائة وسبع عشرة • » • وه له سه‌ره‌تاوه نووسیویه : « ابتدأت بشرحه ٢٢ ربیع الاول ١٣١٧ •

## ٣ ـ قه‌واعیدی نه‌حوو صه‌رفی کوردی :

نه‌متوانی‌هه ندیك لـه باره‌ی ئه‌م کتیبه‌وه بنووسم ؛ چونکه ده‌س نووسه‌که‌ی دانه‌ر لای « ماموستا شیخ محمدی خاڵه » که له « ماموستا مه‌لا سه‌لامی » وه‌رگرتووه‌و مه‌یدانی دیتنیم نه‌بو •

گومان له‌وه‌دانیه که ئه‌م کتیبه‌ی ماموستا مه‌لا ره‌شید به‌گ کتیبێکی زۆر بایه‌خدارو به که‌ڵکه‌و به‌ری ره‌نجێکی بێ پایانی ئه‌و زانا به‌رزه‌یه‌و لـه مه‌یدانی خۆیدا بـه تۆبه‌ره دائه‌نرێ له‌باره‌ی ده‌ستووری « نه‌حوو صه‌رفی » کوردی‌یه‌وه‌و ، سـه‌رچاوه‌یه‌کی بڕوا پێکراوه بۆ هـه‌وڵو ته‌قالایه‌ك که له‌مه‌ولا بدرێ له‌و باره‌یه‌وه ••

ئه‌مانه‌ن ئه‌و نووسراوو دانراوانه‌ی « ماموستا مه‌لا ڕه‌شید به‌گ » که هه‌واڵیان لێ ئه‌زانین‌و ناومان بیستوون •

به‌ڵام دوورنیه ئه‌م زانایه جگه له‌مانه نووسراوی که‌ی هه‌بێ وه‌ئیمه هه‌واڵیان نه‌زانین ؛ چونکه زانایه‌کی وا که‌خاوه‌نی گه‌لێ هه‌ستو بیری جوان بووبێ بڕوا ناکرێ سی‌ودووساڵ له ژیانی له تورکیا بردبێته‌سه‌ر به‌بێ گه‌لێ به‌رهه‌می نایاب له‌گه‌لێ باره‌وه • له گه‌ڵ ئه‌وه‌دا ئاره‌زووی هه‌ڵبه‌ستو نووسینی بووه ، وه له « مجمع البحرين »« که‌شیدا هه‌ڵبه‌ستی هه‌یه به‌لام له‌به‌ر ئه‌وه‌ی من ته‌واوی کتیبه‌که‌م لـه به‌رده‌ستانیه‌و به‌ش‌به‌ش بۆم دێ پێم‌نه‌کرا نموونه‌یه‌ك له هه‌ڵبه‌سته‌کانی بخه‌مه پێش‌چاوو باسێکی لێوه بکه‌م •

## خیزان‌و نه‌وه‌ی :

ئه‌م زانا به‌رزه سێ‌ژنی هێناوه ؛ دوانیان له کوردوستان ، یه‌کێکیان ـ وه‌کو له سه‌ره‌تاوه باسمان کرد ـ ناوی « ڕه‌زێ خان »ه کچی « مامۆستا مه‌لا حمه أمینی » برای مامۆستای پێنجوێنی‌یه • له‌م خێزانه‌ی دوو کچی بووه « حه‌فصه‌خان » کـه شووی کردووه به‌که‌ریم بـه‌گی حمـه‌دبه‌گی قادرپاشا •

کچه‌که‌ی که‌ی ناوی «رووناك‌خان»ه ـعایشه‌ـ شووی کردووه به برازای خۆی که نوری‌به‌گی کوڕی حمه‌دبه‌گه • ژنه‌که‌ی که‌ی ناوی « ئامینه‌خان » بووه ، ئه‌م ژنه‌ی چووه بۆ تورکیا ، وه کوڕێك‌و کچێکی لێ‌ی هه‌یـه « خه‌دیجه » و « بهجت‌نه‌وزاد » ئه‌م کچ‌و کوڕه‌ی له تورکیان •

له تورکیایش ژنیکی هیناوه یه‌ك کچی لی‌ی بووه •

## هه‌ندیك له فه‌رمان‌و کاری تورکیای :(١)

وه‌کو له‌پێشه‌وه باسمان‌کرد ئه‌م مامۆستا پایه به‌رزه پێش شه‌ڕی جیهانی یه‌که‌م چووه بۆ ئه‌سته‌موول • هۆی چوونه‌که‌شی ئه‌وه‌بووه که بکرێ به قازی له سلێمانی ، به‌ڵام له‌و کاته‌دا که ئه‌م چووه‌ته تورکیـا شه‌ڕی جیهانی هه‌ڵگیرساوه‌و ئه‌میش له‌وێ گیراوه به ئه‌فسه‌ر ـ ضابط ئیحتیاطی به‌شی ئیعاشـه ـ ، پاش کوتایی هاتنی شـه‌ر فه‌رمانی داد‌گه‌ر ـ حاکم ـ یه‌تی له شاری « أطنه » دراوه‌تێ له‌و فه‌رمانه‌دا ماوه‌ته‌وه تا سالی ١٩٣٤ز ، لـه‌و ساله‌دا خانه‌نشین کراوه ، پاش خانه‌نشین کردنی

(١) ئه‌م زانیاری‌یانه‌م له مامۆستا مه‌لاسه‌لامی کوڕی مامۆستا مه‌لا حسینی پیسکه‌ندی وه‌رگرتووه •

چووەتە شاری « بورسە » ، ماوەیەکیش لەوێ فـەرمانی « واعظ »ی مزگەوتی « ئەمیر سولطانی بوخاری » دراوەتی • پاش ماوەیەك چووەتە ئەستەموولْ ، لە گەڕەکی « لالەلی » دانیشتووە دووبارە کراوە بە واعیظـە مزگەوتی « لالەلی » • ئەمەش ناونیشان ـ عنوان ـی ئەستەموولی بووە : تورکیا ، ئەستەموولْ ، لالەلی ، ئاقسەرای جادەسی ، نومرە ۲۷ ئانەدە ، حاکمی موتەقاعید ڕەشید بەگی بابان •

**محمدعلی قەرەداغی**



وێنەی هاوڕێ گیانی لەبیرنەچووی دانەر « مامۆستا مەلا حسێنی پیسکەندی » ، کە لە گەڵ جێگەدا دانەر ناوی ئەبا ٠

## وەصیەت نامە[1]

وصيتي الى ملا حسين وابنه السلام ــ سەلامی خوایان لەسەربێ !!

بیستودوو مانگی تەواوە دەستم کردووە بە تەرجەمەی « مسلم » و « بخاری » وا ئەمساڵ لە دوانزەی « محرم الحراما » بحمدالله تەواوبو • هەرچەندە هەردوو کتێبەکە لە سی « ابواب »ی « فقه » تەرتیب کراون مەسلەکیان لەیەك جوێیە ، هەریەك لە مەسلەکی خۆیا نەظەرێکی مەعقوولی هەیە ؛ مسلم رحمە الله ــ لە کوللی بابێکا ئەو حەدیثانەی کەریوایەتی کردووە طوروقی سەنەدەکانی هەموو کۆکردوەتەوە ئەمجا حەدیثەکەی ذیکر کردووە ، کوللی حەدیثێکی لە بابی خۆیا ذیکر کردووە ، کەم وا واقیع ئەبی کە حەدیثێکی لە دوو بابا ذیکر کردبی

بوخاری ــ رحمە الله تعالی ــ حەدیثێکی بە موناسەبە لە ئەبوابی « متفرقه »دا ذیکر کردووە لە هەرجێیەکا بە طەریقێکی غەیری طەریقی پێشوو ئەو حەدیثەی یابەتەواوی ، یاپارچەیێ ، بە موسنەدی ، یابە موعەللەقی ئیعادە کردوەتەوە[2] ، تەرجەمەیکی موناسب بەو بابەی بو داناوە ، وائەبی بەو نەوعە تەنها حەدیثێکی لەدوو یاسی

(١) ئەم « وصیەت نامە » لە کۆتایی کتێبەدا نووسراوە ، بەڵام لەبەرئەوە گەلێ پەیوەندی هەیە بەگشت کتێبەکەوە ، وە گەلێ سوودی لێ وەرەگیرێ پێشمان خست بۆ ئێرە • وە لە کاتی خۆیشیا ــ پشت بەخوا ــ لە جێگەی خۆیا ئەینووسین • م• ع• ق•

(٢) بو زانینی مانای « مسند » و « معلق » و « سند » و ••• هتد تەماشای ئەو « کورتە »یە بکە کە دانەر لەسەرەتای ئەم کتێبەدا نووسیویە ، وەئەم جۆرە ئزاراو ــ اصطلاحات ــ انەی تێدا باسکردووە م• ع• ق•

« الی » بیست جێگەدا ئیعادە کردوەتەوە • بە سەبەب ئەوەوە ئەحادیثی بۆخاری ــ کە ئەمجا دوهەزارو حەوصەدبێ ــ گەیوە بە نزیکی هەشت هەزار • ئەحادیثی مسلم گەیوە بە نزیکی پێنج هەزار •

تا پێم کرابێ وەك مسلم ئەحادیثی بابێکم ــ با موناسەبەی بە گەلێ باب بێ ــ هەر لەیەکێ لەو بابانەما نووسیوە ، ئیسنادەکانیشم مەجبووری-یەت حاصڵ نەبووبێ هەمووم « طی » کردووە ، تەنها صەحابی حەدیثەکەم نووسیوە •

ئەو پیاوانە ــ رحمهم الله تعالی ــ تا بە عیلمی دەقیقی مسلمو بوخاری‌و مەشایخی ئەوان ، تا بەگەورەو بچووکیان بە تەواوەتی تەحقیقی وثووق‌و حیفظو دیانەتیان نەکرابێ ــ کە ئەو تەحقیقاتە بۆ ئەهلی ئەم زەمانە لە ئیمکان خاریجە ــ نەقڵی حەدیثیان لێ نەکردووە • ئێمە ئەوانە هیچیان ناناسین ، ئیعتیمادی مسلمو بوخاری بەوان بۆ دوای خۆیان کافی‌یە ، بۆ ئێمە هەر ئەوەندە لازمە کە بزانین حەدیثی مسلمو بوخاری‌یە ، لە سەر عیلمو فەضل‌و وثووق‌و قووەتی حیفظی ئەو دوو « نیری اعظم »•[1] ئیجماعی هەموو ئەهلی سونەت وجەماعەت هەیە • ئەو دوو کتێبە لە دوای قورئانی جەلیل ئەصەحی کوتوبی ئیسلامی‌یەن •• ــ أحسن الله جزاءهما مع سائر المحدثین والمجتهدین والعلماء الناقلین !!

بەم ئیختیصارە حەدیثی هەردوو کتێبەکە هاتوەتە سەر سێ‌هەزارو

(١) لە ووشەی « نیر »دا ئیشارە ئەکا بۆ ناوی کتێبەکە کەئەلی : « اقتران النیرین » « نیرین » موسلیمو بوخارین ــ خوایان لێ‌رازی‌بێ ــ م• ع• ق•

نۆسەدو شەصتو پێنج حەدیث ، ئەگەر بەتەواوەتی « تنقیح » بکرێ ڕەنگە گەلێ لەو میقدارەیش کەمتر بکا •

بەئەمری مەلا حسین ناوم ناوە « اقتران النیرین في مجمع البحرین »

لـە عومری حەفتاودوو سالیما ئـەم بارە قورصـەم هەڵگرت لـە حەفتاوچوار سالیما ـ بتوفیق الله تعالی ـ تەواوم کرد •

لە کۆکردنەوەیاو نووسینیا لە بەرپیریو دەست لەرزینو فوتووری عەقلو ذیهنو شوعوور زۆر زەحمەتم تیا کێشاوە ، ڕەنگە لە تەرجەمەیشیا غەڵەطو سەهوم زۆربێ ، ئومێدم لەخزمەتتانا وایە کە غەڵەطێ یا سەهوێکتان بەچاوکرد زۆرم لەسەرو گوێلاك بدەن تا ئیصلاحی ئەکەن • مەیشێلن بفەوتێو مەحـو بێتەوە ، لە ئەهـلی خۆی مەنعمەکەن ، ئەمە شتێکە بۆ عەوامو نائاشنا بە عولوومی عەرەبی‌یە کراوە ، عولەما ئیحتیاجیان پێی نیە •

ئەوی عەرەبی ئەزانێ هەر مەتنی حەدیثەکەی بنووسێ ؛ چونکی جامیعی هەموو موسلیمو بوخاری‌یە ، حەدیثیکیان لی تـەرك نەکراوە ، ئـەوان لەبەر موختەصەریەتی ئیستیفادەی لێ‌ئەکەن •

ئەوی عەرەبی نازانێ هەر کوردیەکەی بنووسێ ، فەقەط هەردوولا هەردوولای بنووسن بێ فائیدە نابێ •

ئیشارەتەکانم ئەگەرچی لە ئەووەڵەوە نووسیوە « احتیاطا » لێرەیش ئەیان نووسم :

ئەوی لەکەنارەوە نووسیومە مەسەلا ٢/٢٤ هی سەرخەطەکە حەدیثی ئەو بابەیە • مەسەلا ایمـان ، صـلاة ، صـوم ••• الخ • ئەوی لەژێر خەطەکەدا نووسراوە عەدەدی حەدیثی « اقتران النیرین »• ، لە ئەووەلەوە

تائەو جىيە •

ئەوی لەئاخری کوللی حەدیثێ نووسراوە • مەسەلا $\frac{\text{خ س}}{\text{٢٥}}$ : خ بوخاری ، ١ جەڵدی ئەووەڵ • ٢٥ : صەحیفەی ئەو جەڵدە •• « وعليه فقس » •

$\frac{\text{م - ٢}}{\text{٥٥}}$ م : مسلم • ٢ : جەڵدی دووەم • ٥٥ : صەحیفەی ئەو جەڵدە •

ت : ترمذی • ن بنسائی • د : ابو داود • ج : ابن ماجه • ئەمانەم موافیقی « قسطلانی » نووسیوە •

ئەوەندەکافىيە ، والسلام عليكم ، وادعوا لي بالخير رشيد ••

# کورتەیەکی عیلمی « حدیث »[1]

تەعریفی حەدیثو بەعضی ئیصطیلاحاتی حەدیث تا بزانین چ حەدیثی موعتەبەرە ، چ حەدیثی نابی بە دەلیل ••

یەکی لەوانە کە لە ئوصولی حەدیثا تەئلیفی باشی کردووە « ئەبو عەمری بنی صەلاحی شارەزووری‌یە » ••

حەدیث ـ سوننەت ـ قەولی یا فیعلی یا تەقریری ، یا وەصفی ، یا خلقی ، یا ئەیامی ـ ئیضافە کرابێتە زەمانی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ •

قەولی : ئەوەیە کە فەرموویەتی •
فیعلی : ئەوەیە کە کردوویەتی •

تەقریری : ئەوەیە خۆی نەیکردووە لە پێش چاوی کراوە مەنعی نەکردووە ؛ وەکو خالیدی سیف‌الله لە سەر سوفرەی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ گۆشتی بزن مژی خواردووە پێغەمبەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ مەنعی نەکردووە لە خواردنی • کەوابی بەوە مەعلووم ئەبی بزن مز گۆشتی ئەخوری ••

وەصفی : پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ درێژ نەبووە ، کورت نەبووە •

خولوقی : سەخی بووە ، شەجیع بووە حەلیم و رەئووفو رەحیمو قانیعو زاهید بووە ، جوێنی بە کەس نەداوە ، لە کەسی نەداوە ، موقابەلەی خراپەی بە چاکە کردووە ••

(١) خۆم ئەم شادیرەم بۆ ئەم باسە دانا • م• ع• ق•

ئەیامی : وەکو شەهادەتی « حمزة » ، قەتلی « ابو جهل » • ئەمانە هەموو پیان ئەلێن حەدیث ، پیان ئەلێن : سونەت • لە قەسطەلانی تەقسیم کراوە بە سی‌ونو قیسم بە موختەصەری ذیکریان ئەکەم :

١ ـ متواتر : حەدیثێکە کە عەدەدیکی زور لە پیغەمەریانەوە نەقل کردبی کە ئەو عەدەدە مومکین نەبی کە هە موو لە سەر درو ئیتیفاق بکەن ؛ وەك بوونی بەغداو بەصرەو مەککەو چین کە نەمان‌دیوەو نەچووین لە لامان یەقینە کە هەموو هەن • ئەو حەدیثەیش لە لامان یەقین ئەبی کە پیغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرموویەتی • ئیفادەی « علم الیقـین » ئەکا • عەدەدیکی وایش لـە وانـەوە عـەدەدیکی وایش لەوانـەوە تاپتـە سـەر ئـەو « موحەددیثـە » کـە ریوایەتی حەدیثەکە ئەکا ؛ وەك حەدیثی : « من کذب علیّ متعمدا فلیتبوأ مقعده من النار » : هەر کەسی بە عەمد درویی بە دەم منەوە بکا با جی‌ی خوی لە ئاگرا حازر بکا • دووصەد صەحابە لە پیغەمەریانەوە نەقل کردووە ـ علیه الصلاة والسلام ، وعلیهم الرضوان ••

٢ ـ مشهور : حەدیثێکە کە جەماعەتیکی زور ریوایەتی بکا ئەمما عەدەدەکەی نەگاتە عددەدی تەواتور ، ئەوە عیلمی نەظەری ئیفادە ئەکا ؛ وەك حەدیثی : « انما الاعمال بالنیات » • ئەمە ئەووەل ئەقسامی حەدیثی ئاحادە • ئەمما لە یحیای بنی سعیدی بنی قیسی ئەنصاری‌یەوە بووە بە مەشهوور • لە پیغەمەرەوە ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەنهـا عمـر ـ رضی الله تعالی عنه ـ ریوایەتی ئەکا ، لەوەوە علقمەی بنی وقاص ، لەوەوە محمدی بنی ابراهیمی تەیمی ، لەوەوە یحیا ، لـە یحیاوە شوهرەتی پستووە ، ئەمما غەیری عمر ـ رضی الله تعالی عنه ـ گەلی

صەحابی تریش لە پیغەمەریان بیستووە ـ صلی اللّه تعالی علیه وسلم ـ • لە ئیعتبارا حوکمی موتەواتەری هەیە •

٣ ـ حەدیثی « صحیح » ئەوەیە : کە سەنەدەکەی ـ یەعنی ئەوانەی کە لە بیغەمەرەوە ـ صلی اللّه تعالی علیه وسلم ـ نەقلی حەدیثەکە ئەکەن تایتە سەر ئەو موحەددیثەی کە ریوایەتی ئەکا ـ هەموویان عەدل بن مەعلووم بووبی کە هیچ فیسقیان لی صادر نەبووەو عەدالەتی زاهیرو باطینیان ببی ، شاذیان تیا نەبی ـ یەعنی ئەو راویە عەدلە لە ریوایەتی حەدیثەکەدا موخالەفەی جەماعەتیکی تری نەکردبی لەوانـەی عـەدلو مەوثووقن ، بەو نەوعە جەماعەتی لە حوففاظی مەوثووق کەلیمەیەکیان ذیکر کردبی ئەو ذیکری نەکا ، یا ئەوان ذیکریان نەکردبی ئەو ذیکری بکا ، لە سەنەدا یالەمەتنابی • یەعنی موخالەفەی حافیظی مەوثووقی لە خوی گەورەتر نـەکا • حافیظیکی بەقووەت بی ، ضەبطی حەدیث بـە تەواوی بکا ، عیللەتیکی پەنهانی تیا نەبی کە هەموو کەس فەرقی نەکاو زەرەر بگەیەنی بە صیحەتی حەدیثەکە • ئەو سیلسیلەی راویانە ئەبی هەموو بەو نەوعە بن هەموو حەدیثی « بخاری » و « مسلم » لەو نەوعەن بە ئیتیفاقی صەرافی عیلمی حەدیث •

صەحیح ئیستیدلالی پی ئەکری موخالەفەی دروست نیە ••

٤ ـ حسن : ئەو حەدیثەیە کە رجالی سەنەدەکەی بەقەد رجالی صـەحیح موعتەبەر نەبن ، کەمیك لەوان خوارتربن ، هـەم راوی حەدیثەکە مەشهووری راوی ئەهلی شاریکبی ؟ مەسەلا قەتادە مەشهوور بووە بە راوی ئەهلی بەصرە ، ئەگەر حەدیثی موحەدیثینی بەصرە قەتادە

ریوایەتی بکا راویەکەی مەعلوومە ، ئەگەر غەیری قەتادە ریوایەتی بکا راویەکەی مەعرووف نیە • ئەو حەدیثە نابی بە « حسن » •

حسن ئیستیدلالی پی ئەکری ، موخالەفەی دروست نیە ، لە بەینی راویەکانیشا نابی هیچیان تەرك بکرین ••

٥ ـ صالح لە خوار حەسەنەوەیە ئەوەی صالح بی بو ئیستیدلال یا بو تەقویەی حەدیثیکی ترە •

٦ ـ مضعف : لە خوار صالحەوەیە ؛ بەعزی لە راویەکان ئیتیفاق لە سەر زەعیفیان نەبی • ئەمەیش موعتەبەرە • قسطلانی ئەلی : کەمی لەمانە لە بوخاری‌دا هەیە ••

٧ ـ ضعیف : ئەمەیە ئیتیفاق لە سەر ضعیفی راویانی ببی ، تا « ضعیف »تر بن حەدیثەکە ضەعیفتر ئەبی • ئیستدلالی پی ناکری لە بوخاری‌دا هیچ لەمانە نیە ••

٨ ـ مرفوع : ئەو حەدیثەیە کە بلی : « عن ، قال ، ان ••• » رسول الله ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ قەول بی فیعل بی ، تەقریر بی « متصل » بی ، هیچ راوی حـەزف نەکرابی ، « منقطع »بی ، بەعزی راوی تەرك کرابی ، « مرسل » بی صەحابە تەرك کرابی • « ضعیف » بی ••• والحاصل هەر نەوعی بی لە ئەنواعی حەدیث کە ئیضافە کرایە سەر پیغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئەبی بە « مرفوع » ؛ ئەوی شەرایتی صیحەتی تیـــایە موعتەبەرە « والا » موعتەبەر نیە • موقابیلی « مرفوع » « موقوف » • ••

٩ ـ موقوف : ئەو حەدیثەیە کە لە سەر صەحابە ئیتیهای هاتبی ؟

وەکو صەحابە بفەرموون : ئیمە وامان ئەکرد ، ئەمما بەو شەرتە نەفەرموون لە زەمانی پیغەمبەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - والا بە مەرفووع حسیبە •• صەحابە بفەرموی : سوننەتە ، یا ئەمرمان پی کرا ، یا نە هیمان لی‌کرا ، یا بومان موباح‌کرا ئەبی بە مەرفووع • تابیعی یا خوار تابیعی بلین : فلان کەس وای فەرموو ، رەفعی کرد یانەی کرد ، یا نیسبەتی ئەدا ، یا حەدیثەکەی ئەگەیانە جیی خوی ، یا ئیسنادی ئەدا مەرفووعە بەبی خیلاف • ئەو تابیعی‌یە لە بەر ئیحتیاط وائەکا شکی هەیە لە صیغەی ریوایەتەکەدا کە راویەکە « قال »ی فەرمووە ، یا « سمعت » ، یا « عن » ، یا « ان » ، یا « حدث » ، یا « اخبر رسول الله » صلی الله تعالی علیه وسلم - لە مانە کامیانی فەرمووە •

١٠ - تابیعی بلی : وامان ئەکرد « مقطوع »ە ؟ ئەگەر بلی : لە زەمانی صاحابەدا وامان ئەکرد ئەگەر صەحابە « مطلع » بووبی بە سەریا ئەبی بە « موقوف » ، ئەگەر نەبی « مقطوع »ە ؟ ئەگەر صەحابە شتیك بفەرموی مەجالی ئیجتیهادی تیا نەبی حوکمی مەرفووعی هەیە ؟ وەکو قەولی ابن‌مسعود فەرموویەتی : هەرکەسی بچیتە لای ساحیری یا « عراف »ی[1] بە تەحقیق ئەو کەسە کافرە بەوەی کەنازل بوەتە سەر محمد - صلی الله تعالی علیه وسلم - ؟ چونکە ابن‌مسعود - رضی الله تعالی عنه - لە پیغەمبەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - ی نەبیستی لە خویەوە شتی وا نا فەرموی • بە مەوقووف « آثر » یشی پی ئەلین •

---

(١) عراف : ئەوانەن خەبەری داهاتو بە خەلق ئەلین ، باس لە غەیب - نادیاری - ئەکەن‌و ، هەوالی گەلی شت بەهوی هەندی زانینی بی بناغەوە بە خەلق ئەلین •

١١ ـ مسند ، موصول ، متصل : ئەو حەدیثەیە ئەگەر مەوقووف بی تاسەر صەحابە ، ئەگەر مەرفووع بی تا سەر پیغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لە راویەکانی هیچ تەرك نەکرابی ، بەوەی ئیتیصالی ببی تا تابیعی نالین « موصول » یا « متصل » ئەمما ئەلی‌ی « متصل » تا سعیدی بنی مسیب ، یا تازهری • موقابیلی مەوصوول :

١٢ ـ « مرسل »ە : کە لە بەینا صەحابە تەرك کرابی ، تابیعی بلی : قال رسول الله ـ صلی الله علیه وسلم ـ • مرسل زەعیفە • لە لای شافیعی ـ رضی الله تعالی عنه ـ نابی بە دەلیل فەقەط موڕسەلی « ابن المسیب » ئەبی بە دەلیل • بە خیلافی موڕسەلی حسنی بصری ؛ چونکە مورسەلی لە وەجهیکی ترەوە ئیسناد دراوە یا تەئید کراوە بە حەدیثی مورسەلیکی تر کە ئەو حەدیثەی لە غەیری مەشایخی مرسلی سـعید بیستووە • ئیمامی ئەعظەم ئیستیدلالی پی ئەکا ••

مورسەلی صەحابی وەکو ابن وعبـاس ـ رضی الله تعالی عنه ـ بەعزی حەدیثی لە حەزرەتی « ام المؤمنین » ـ رضی الله تعالی عنها ـ بیستووە بفەرموی : قال رسول الله ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ • یاوەکو حەزرەتی عائیشە ـ رضی الله تعالی عنها ـ کە حەدیثی بەدئی وەحی ریوایەت ئەکا « والحال » ئەو لەو وەختەدا نەهاتووەتە دونیاوە • ئەم نەوعە حەدیثانە هەمووی مەرفووعەو ئیحتیجاجی پی ئەکری ؛ چونکە صەحابە هەموو عەدلن‌و درویان ـ با خوصووص لە حەدیثا ـ لی صادر نابی ـ رضوان الله تعالی علیهم •

١٣ ـ منقطع : تابیعی یا راویەکی تر لە جی‌ی یا لە زیاتر تەرك کرابی ، بەو شەرتە دوانیان لە تەنیشت یەکەوە نەبن • بەدەلیل نابی •

« مقطوع » قەول‌و فیعلی تابیعی‌یە نابی بە حوججەت ••

١٤ ـ معضل : دوو راوی لە تەنیشت یەکەوە تەرك کرابی ؛ وەك تابیعی تابیعی بلی : قال رسول الله ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ نابی بە دەلیل ••

١٥ ـ معنعن : بە « عن » بی ••

١٦ ـ مؤنن : بلی‌ی : « ان فلانا قال ان فلانا مثلا » بە « موصول » حسیبە ئەگەر « معنعن عنه » مەعرووف بی « معنعن » « مدلس » نەبی ، هیچ نەبی لە عومری خویا دەفعەیی مولاقی بووبی بـە « معنعن عنـه » ـ کە شەرتی بوخاری‌یە ـ • یا موعاصیری بی ـ کە شەرتی موسلیمە ـ • شافیعی لە سەر شەرتی بوخاری‌یە ـ رحمهم الله ـ ••

١٧ ـ معلق : ئەووەلی ئیسنادەکەی حەزف کرابی ؛ وەکو بوخاری بفەرموی : قال ابن عباس ـ رضی الله تعالی عنهما ـ ••

١٨ ـ مدلس : تـەدلیس حیلەکردنە بو تەرویجی حەدیثەکەی سیانە :

أ ـ تەدلیسی ئیسقاط : ماموستاکەی حەزف بکا ، ماموستای ماموستای دیکر بکا بە لەفزی کە « موهم »ی ئیتیصال بی وەك بلی : عن فلان ، یا ان فلانا • ئەمما « اجزنا » یا « سمعت » نەلی ، ئەگەر ئەوانە بلی ئەبی بە دروی مەحز • ئەم نەوعە وەختی ئەبی بە تەدلیس کە موعاصیری بی‌و لی‌ی بیستبی ، یا ئەو حەدیثەی لی نەبیستبی • ئەوانەی کە مەشهوورو مەعرووفن بە تەدلیس حەدیثی « معنعن » و « مؤنن »یان لی قوبوول ناکری مەگەر تەصریح بکا بە ئیتیصالی بلی : لە فلانم بیست ، یا فلان

خەبەری داومی • ئەو وەختە لێی قوبوول ئەکری • اعمش ، قتادە ، سفیانی ثوری ، « مدلس »ن لە « صحیحین »ا ئەوی لەوانە ریوایەت کرابێ تەصریحیان بە ئیتیصال کردووە •

ب ــ تەدلیسی تەسویە خراپترینی هەموو تەدلیسێکە ئەوەیە : ماموستای خوی حافیظو مەوثووقو ضابیطە ماموستای ماموستاکەی ضەعیفە ، ماموستای ماموستای ماموستاکەیشی بە قووەتە ، ئەو راویە بینی ماموستای ماموستاکەی حەزف بکا جونکە ضەعیفە • بینی ماموستای خوی‌و ماموستای ماموستاکەی زیکر بکا تا هەموو سیلسیلەکە بە قووەت بێ بەوە خەلق تەفرە بدا کە حەدیثەکەم بە قووەتە •

ج ــ تەدلیسی شیووخ : ئەوەیە ماموستاکەی ناوێکی مەعلوومی بێ ، ناوێکی یا صیفەتێکی غەیرە مەعرووفیشی هەبێ ئەو موحەددیثە بینی ماموستاکەی بە ناوە غەیرە مەعرووفەکەی ذیکر بکا ، ئەگەر ئەو موحەددیثە لەو تەعمیەی کە ئەیکا غەرەزێکی صەحیحی بێ ؟ وەك تەشحیذی ئەذهان ، تەجرەبەی راوی‌و قوتابی خوی ••• دروستە • ئەگەر مەحضەن بو تەرویجی حەدیثەکە یا بو شوێنەونی ماموستاکەی بکا مەردوودە •

١٩ ــ مدرج : قسەیێ بخەیتە ناو حەدیثێکەوە ، یا کەلیمەیێ لە حەدیثی بخەیتە ناو حەدیثێکی ترەوە ؟ وەکو حەدیثی : « لا تباغضوا » : یەکتری مەبوغزێنن « ولا تحاسدوا » : تەمەنناى زەوالی نیعمەتی یەکتری مەکەن ، « ولا تدابروا » : قسە لە گەل یەکتر مەبرنەوە کە تووشی یەکتربوون پشت بکەنە یەك ئەم بەلایکاو ئەو بە لایکا بروا • « ولا تنافسوا » : لە بەینی خوتانا رەغبەتی ئەوەتان نەبێ کە هەرکەسی حەزکا

که شتی چاكو نەفیس بو خوی بی • ئەمما بەبی تەمەننی زەوالی نیعمەتی ئەوی تر • ئەگەر وابی ئەبی بە حەسەدی حەرام • « ولا تنافسوا » لەم حەدیثەدا نیە سعیدی کوری ابو مریم کە یەکیکە لە راوی ئەم حەدیثە ئەو جوملەیەی لە حەدیثیکی ترەوە هیناوە ••

۲۰ ـ عالی پینجە :

۱ ـ مطلق : نزیك بوونی ڕاویەکەیە لە پیغەمەرەوە ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ، مەسەلا ڕاویی حەدیثی بە سی واسیطە بباتە سەر پیغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ راویکی تر عەینی ئەو حەدیثە بە چوار واسیطە بگەینیتە سەر پیغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ••

۲ ـ نزیك بوون لە ئیمامیکی گەورە ؛ وەك شافیعی ، وەك مالك ـ رحمهما الله ـ •

۳ ـ نزیك بوون لە ئەصحابی کوتوبی « ستة » •

٤ ـ دو راوی حەدیثی یەکیکیان لە پیشەوە وە فات بکا ، ئەوی ریوایەت لەم بکا عالییە ، ئەوی ریوایەت بە نیسبەت ئەوەی کە ریوایەت ئەکا لەوەی کە لە دواییدا وەفاتی کردبی ••

٥ ـ دو موحەدیث هەر لە ماموستایی حەدیثی ریوایەت بکەن فەقەط ئەوی لە پیشترا لیی بیستبی حەدیثەکەی « عالی »یە •

۲۱ ـ موقابیلی هەر عالییی « نازل »ی هەیە ••

۲۲ ـ مسلسل : ئەو حەدیثەیە لە ئەوەلەوە تا ئاخر لە سەر حالەتی ریوایەت بکری یا هەمووی « قال » بی ، یا هەمووی « عن » ، یا « ان » ،

یا « حدثنا » ، یا « اخبرنا » بی مەسەلا •

٢٣ ـ غریب : هەر راویی ریوایەتی بکا شەریکی نەبی لە ریوایەتا • بەعزیکی صەحیحە ؛ وەکو ئەوانە کە لە « صحیحین »ایە ، بەعزیکی زەعیفە موعتەبەر نیە ، بەعزیکی « حسن »ە ئەویش موعتەبەرە ••

٢٤ ـ عزیز : تەنها دوو یا سی راوی ریوایەتی بکا ••

٢٥ ـ معلل : عیللەتیکی پەنهانی تیابی هەموو کەسی تیی نەگا ، زاهیرەکەیشی سەلامەتە لە عیللەت بەم نەوعە کە راویەکەی موخالەفەی لە خوی حافیظتری بە ضەبتتر بکاو هیچ حەدیثی نەبی کە تەقویەی بکاو دەلیلیکیش ببی لە سەر غەلەتی راوییەکەی کە مورسەلی کردووە بە مەوصوول ، مەرفووعی کردووە بە مەوقووف • حەدیثی یا قسەیەکی تری دەرجی حەدیثیکی تر کردووە ، وەکو حەدیثی یعلیی بنی عبید لە ثورییەوە ریوایەت ئەکا کە عەمری بنی دینار ریوایەتی کردووە : « البیعان بالخیار » یعلی بەغەلەتا چووە کە عەمری بنی دیناری ذیکر کردووە • عەمر نیە عبداللّەی بنی دینارە ، هەموو ئەصحابی ثوری لە ثورییەوە عبداللّەیان ذیکر کردووە • سەبەبی غەلەتەکەی ئەمەیە : عبداللّەو عەمر ناوی باوکیان یەکە ، ماموستایان یەکە زەمانی وەفاتیان لیك نزیکە •• هەم وەکو حەدیثی قەتادە نووسیویەتی بو « اوزاعی » کە انس فەرموویەتی : لە پشت پیغەمەرەوە ـ صلی اللّە تعالی علیه وسلم ـو ابو بکرو عمرو عثمانەوە ـ رضی اللّە تعالی عنهم ـ نویژم کردووە ، ئیفتیتاحیان کردووە بە « الحمد للّە رب العالمین » ذیکری « بسم اللّە الرحمن الرحیم » یان نەکردووە نە لە پیشی قیرائەتەوەو نە لە دوای قیرائەتەوە • ئیمامی

شافیعی ـ رضی الله تعالی عنه ـ فەرموویەتی :. ئــەم حەدیثە موعەللەلە حەوت یا هــەشت راوی موخالەفــەیان کردووە ، بەحثیان لە نەبوونی « بسم الله الرحمن الرحیم » نەکردووە • مەعنای وایە دەستیان کردووە بە قیرائەتی فاتیحە لە پیش قیرائەتی سوورەتی ترا • مەعنای وانیە کە « بسم الله الرحمن الرحیم »یان تەرك کردووە • راوی لە مەعنایا بە غەلەتا چووە وا تی گەیوە لەمە کە ئەنەس فەرموویەتی دە ستیان کردووە بــە « الحمد لله رب العالمین » کــە « بسم الله »یان تەرك کردووە ، ی گەینەکەی خویی دەرجی حەدیثــەکە کردووە ، لەوەدا بــە غەلەتا چووە • بە دەلیلی ئەمە لە انس‌یان پرسی کە پیغەمەر ــ صلی الله تعــالی علیه وسلم ــ لە پیشا دەستی کردووە بــە « الحمد لله رب العالمــین » یابــە « بسم الله الرحمن الرحیم » ؟ انس لــە جوابیانا فەرموویەتی : شتیکم لی ئەپرسی کە حفیظکم نەکردووەو کەسیش لی‌ی نەپرسیوم « مع ما فیه » قتادە خوی بە کویری لە دایك بووە کاتبەکەیشی نەی‌زانیوە •

ئەم نەوعە عیللەتە مەگەر ئیمامیکی وەك شافیعی ـ رضی الله تعالی عنه ـ زەفەری پی‌با ئەوەندە وردە ••

٢٦ ـ فەرد فەردی موطلەق ئەوەیە کە هەر راویی ریوایەتی بکا کەسی تر ریوایەتی نەکا ••

فەردی نیسبی : موقەیەدبی بە یەك ثیقەوە ، هەر ئەو ریوایەتی کردبی لە صاحیبی ئەو حەدیثەوە ؟ مەسەلا حمزەی بنی سعید ریوایەتی ە ابی واقدی لیثی‌یەوە کردووە کە پیغەمەر ــ صــلی الله تعــالی علیــە وسلم ــ لە نویژی جەژنا « ق »و « اقترب »ەی خوینووە عبیدالله بنی عبدالله کە راوی ابی‌واقدە ئەو حەدیثەی لی ریوایەت نەکردووە ، حمزە

لەعبیداللە جوی بوەتەوە ••

یا ئەو حەدیثە هەر موحەددیثی شاری ڕیوایەتی بکا وەك مەدینە یا بەصرە ؟ وەکو حەدیثی ئەمە : کە پێغەمەر ـ صلی اللە تعالی علیە وسلم ـ ئەمری پی کردووین کــە « فاتحـة الکتاب »و ئــەوی « میســر » بی بیخوینین • غەیری موحەددیثی بەصرە ریوایەتیان نەکردووە ، پیغەمەر ـ صلی اللە تعالی علیە وسلم ـ مەسحی سەری کردووە بەئاوی غەیری ئەو ئاوە کە لە دەستی ماوەتەوە • هەر میصری ریوایەتیان کردووە • یا هەر یەکی لە یەکیکی ریوایەت کردبی ؟ وەك حەدیثی ئەمە کە پیغەمەر ـ صلی اللە تعالی علیە وسلم ـ بو وەلیمەی « صفیە » قاوتو خورمای کردووە بە زیافەت • لە انسەوە بکر لە بکرەوە تەنها وائل لە وائلەوە تەنها سفیانی بنی عینە • ئەم حەدیثە غەریبە ، فەقەط ترمذی ئەلی : حسنی غەریبە ••

حەدیثی فەرد لە دوای ئەمە کە ثابیت بو کە فەردە ئەگەر گەرایتو لە یەکیکی ترەوە ریوایەت کرابی بە « لفظ » بە دوایەکەی ئەلین : « متــابع » • ئەگــەر بەمەعنــا ریوایەت کرابی بــە مەعناکەی ئەلین : « شاهد » • ئەگەر هیچ ریوایەت نەکرابی لە کەسی ترەوە پیی ئەلین : « فەردی مطلق » •

٢٧ ـ شاذ : ئەوەیە راوی مەوثووق موخالەفەی جەماعەتی لــە مەوثووقی تری کردبی ، لیی زیاد کردبی یالیی نەقص کــردبی • ئەگەر مەوثووق موخالەفەی لە خوی مەوثووق تری کردبی حەدیثەکەی شــاذی مەردوودە • ئەگەر غەیری ئــەو ریوایەتی نەکردبی خویشی عەدلبی حەدیثەکەی صەحیحە ، ئەگەر غەیری ئەو ریوایەتی نەکردبی

خویشی عەدل بی حەدیثەکەی صەحیحە ، ئەگەر خوی عەدل بیو لـە ضەبطا کەمی نوقصانی ببی حەدیثەکەی حەسەنە • ئەگەر خوی زور دوور بی لە ضەبطەوە حەدیثەکەی شاذی مونکەرە ••

۲۸ ـ منکر ئەوەیە هەر راویەکی بی « متابع »و « شاهد »ی نەبی ئەویش وەکو شاذ وایە لـــە ئەقساما بەعزیکی موعتەبەرەو بەعزیکی موعتەبەر نیە •

۲۹ ـ مضطرب : تیك شلەقابی هەر یەکە بە نەوعیکی ریوایەت بکا یا خوی هەرجارە بە نەوعیکی ریوایەتەکا •

۳۰ ـ موضوع : حەدیثی درویە •

۳۱ ـ مقلوب : ئەمەتە راویەکەی تەبدیل بکری بە راویکی تر ، یا سەنەدی بکەی بەسەنەدی مەتنیکی تر • وەك بەغدایی کردیان لە بوخاری ، بوخاری ـ رضی الله تعالی عنه ـ هەمووی لیك جوی کردەوە • ئەمە « مرکب »یشی پی ئەلین ••

۳۲ ـ منقلب : ئەمەیە لەفظی لە مەتنەکەی بگورری بە لەفظیکی تر وەك لە حەدیثی موخاصەمەی بەهەشتو جەهەننما ریوایەت کراوە ؛ کە خوا مەخلووقی بو جەهەننم خەلق ئەکا صەحیحەکەی وایــە : کــە خوا ـ جل جلالە ـ خەلقی بو بەهەشت خەلق ئەکا ••

۳۳ ـ مدبج : دوو صەحابی ، یا دوو نەظیر لە یەك ریوایەت بکەن ؛ وەك ابو هریرەو عایشە ـ رضی الله تعالی عنهما ـ •

۳٤ ـ مصحف : تەبدیلی نوقتەو شەکلی بکری ؛ وەك « ابی » بکەی بە « ابی » ••

۳٥ ، ۳٦ ـ ناسخ و منسوخ ••

۳۷ ـ مختلف : دوو حەدیث بە زاهیر مەعنایان جوی بی جەمعیان مومکین‌بی ، تەئویلی یەکیکان ئەکەی « تضاد » لە بەینا نەمینی • زانینی ئەم ئیصطیلاحانەنە بو هی وەکو ئیمە هیچ لازم نیە ، بو موجتەهید لازمە •• ئەم میقدارەم بویە نەقل کرد کە بزانین ئەو حەدیثە لە چ نەوعیکە • تەحقیقی ئەوەیش کە حەدیثی لە کەسیکەوە ریوایەت بکری موحەددیثی پیشو تەحقیقیان نەکردبی خاریجی ئیمکانە ئیمە بتوانین تەحقیقی بکەین ؟ چونکە هەزارو سی‌صەدو چل‌و نو سال لە وەفاتی پیغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ رابوردووە هەر ئەوەندە بو ئیمە کافی‌یە لە کتیبیکی موعتەبەرو مەوثووقا بی‌بینین ••

۳۸ ، ۳۹ ـ مؤتلف و مختلف : ئەو حەدیثەیە کە صوورەتی یسمی دوو کەس « متفق » بی تەلەفوظیان جوی بی ؟ وەك « بشار ، نیسار » ، « احنف اخیف » • وهکذا « سَلَمه سَلْمه » •• تەفصیلات لە وەسطەلانی‌و نەوەوی ـ رحمهما الله ـ تەلەب‌کە • بو ئەم موختەصەرە یاهیچ پی‌ی ناوی ، یا کافی‌یە ••

**مجمع البحرين مسلم وبخارى في اقتران النيرين شمس احاديث البخاري قمر احاديث مسلم بل هما الشمس الحقيقي لا يزالان أبد الاباد •**

ناوم نا « مجمع البحرين » مقتبسا من قوله ـ تعالى ـ : « واذ قال موسى لفتاه : لا ابرح حتى ابلغ « مجمع البحرين » أو امضى حقبا ••• » یەکیکان بەحری فارس ، یەکیکیان بەحری روم ، چونکە لە حەقیقەتا هەردووکیان بەحری عیلمی زاهیرو باطینن ، بەیانی ئەحادیثی پیغەمەر ئەکەن ـ علیه الصلاة والسلام ـ کە وەکو نوورن دلی تاریکی خەلق رووناك ئەکەنەوە

لەبەر ئەوە تەعبیری « في اقتران النيرين »م عەلاوەی ئەو ناوە کرد ••

چونکە بو عەوامم کردووە خەواص موحتاج بەم تەرجەمەیە نین هیچ بەحثم لە تەرکیبو کەلیمەی عەرەبی نەکردووە ، چونکە بـەوە خەلق سەری لی ئەشیوی ـ خوا سەریان لی نەشیوینی ، ئیصلاحی حالی دینو دونیایان بکا بە رەحمەت ••

# پێشەکی دانەر[١]

تەرجەمەی « مجمع البحرين » موسلیمو بوخاری بە زوبانی کوردیی سلیمانی •

« اعوذ بالله من الشيطان الرجيم » : پەنا ئەگرم بە خوا لە شەری شەیتانی کە لە رەحمەتی خوا دوور کراوەتەوە ••

« وبه نستعين » : بو تەواو بوونی یاریدەم لە خوا ئەوی ، تەلەبی تەوفیق لە خوا ئەکەم ••

« بسم الله الرحمن الرحيم » : بە واسیطەی ناوو ذاتی خوایی کە لە دونیادا مەرحەمەتی کردووە و ئەیکا بە هەموو مەخلووقات • خوا مەرحەمەتی دونیایی خوی لە موسولمانو گاورو جوو بت پەرستو شەیتان پەرستو ــ حتی لە شەیطانیش ــ دریغی نەکردووە ، حەیاتی داونی ، رزقی داونی ، صیحەتو عافیەتی داونی ، ریگەی چاکەو خراپەی پی نیشان داون • لە ئاخیرەتیشا مەرحەمەت دەکا بە موئمین و موسولمانان عەفویان ئەکا ، لە عەزابی جەهەننەمو ئاگری جەهەننم نەجاتیان ئەدا ، ئەیانباتە بەهەشت •• ( منو مەلا حسینیش ــ بجاه النبي عليه الصلاة والسلام ــ ) ••

من کە عەبدیکی فەقیرو گوناهکارم بە تەوفیقی خوا دەست ئەکەم بە تەرجەمەی « مجمع البحرين » •

حەمدو ثەنا مەخصووصە بە خواوە ، صەلاتو سەلام لە سەر پیغەمەری ئاخرزەمان بی کە رەحمتی خوایەو نیرراوە بو هەموو عالەم •

(١) ئەم ناونیشانە لە زیادەی خومە • م• ع• ق•

هەم صەلاتو سەلام لە سەر ئالو ئەصحابو زورریەتی ئەوو هەموو تەبەعەی ئەوبی ••

لە دوای حەمدو صەلاتو سەلام : ئەم عەبدە گوناهکارو زەلیلو بیچارەیە دەلی : کە عومرم لە حەفتا سال تیپەریوە غەیری گوناه هیچ کاریکی وام نەکردووە کە خوا پیی خوش بی ، هەر خەریکی تەحصیلی رەزای شەیتان بوومو نیعمەتی کە خوا داویمی لە رەزای دوشمنی ئەوا صەرفم کردووە کەچی قەط لیم مەمنوون نەبووەو قەط لیشم مەمنوون نابی ـ خوا منیشو جەمیعی ئیخوانی دینی لە شەری ئەو زالمە لەعینە موحافەظە بکات ! ئامین ••

پینج شەش سالیکە کە تەقاعود کراومو عەمەلمەندە بوومو دونیام پی رازی نابی بە درو بامداوەتەوە سەر کاری ئاخیرەت • ئەمما لە دوای چی ؟ ئەو عومرە باشو زەریفو بە قیمەتەم بە ضایع چو ، بە خورایی رابورد ، ئیستە کە پیر بوومو قووەتم نەماوە چیم لە دەستبی کە بیکەم ؟ چەندم عومر ماوە کە عومری رابوردووی پی بەسەر بگرمەوە ؟

ئیسا هەرچی ببی زور نەبی کەمیش باشە ، تەوفیقم لە خوا تەلەب کرد بو جەمعی ئەحادیثی « مسلم »و « بخاری » بحمد الله مووەفەق بوومو هەردووکم لە جییەکا کو کردەوە ، هەرچی ئەحادیثی کە موکەررەرن هەمووم تەرك کرد ، ریجالی ئیسنادەکانم حەزف کرد ، تەنها ئیکتیفام کرد بە صەحابەیی کە حازری واقیعە بووبی ، یا لە پیغەمبەر ـ علیە الصلاة والسلام ـ ی بیستبی ، یا لەوی دیبی • بی مەجبووریەت غەیری صەحابەم ذیکر نەکردووە ؟ چونکە ئەو پیاوانە ـ خوا موکافاتو ئەجریان بە ضایع نەدا ـ هەموویان عەدل بوون ، هەموو حافیظ بوون ، راست

بوون ، ڕیوایەتیان موعتەبەر بووە • بو ئەو وەختە لازم بوون کە حەدیثی ڕاستو حەدیثی مەوضووعو ضەعیف لیك جوی نەکرابوونەوە ، تەدوینی عیلمی حەدیث نەکرابو ؛ ئیستە کە عولەمای عیلمی حەدیث هیمەتیان کردوەو ئەحادیثی موعتەبەرو غەیرە موعتەبەریان لیك جوی کردووەتەوە کتیبیان تیا تەئلیف کردووە هەر ئەوەندە بو ئیمە لازمە ئەو حەدیثەی کە ئەی‌بینین بزانین کە حەدیثی « مسلم »ە یا هی « بخاري »یە ، یا هی غەیری ئەوانە ؛ چونکە ئەوان ڕاستیان لە درو جوی کردوەتەوە ـ خوا ئەجریان بداتەوەو لی‌یان ڕازی بی ••

بوخاری ـ رحمه الله ، ورضي عنه ـ حەدیثیك کە موناسەبەتی بی بە بیست باب یا زیاتر یا کەمتر لە کوللی بابی لەو بابانەدا یا بەتەواوی یا پارچەیکی تیا ذیکر کردووە ، بەعزی حەدیثیشی بە « معلق » ذیکر کردووە ئیسنادەکەی ذیکر نەکردووە هەر فەرموویەتی ـ مەسەلا ـ : قال انس : قال عبدالله • بەعزی لەوانەی لە جیبەکی ترا بە رجالەکانیەوە بە تەواوی ذیکر کردووە • ئەوانەم هەموو حەزف کردووە مەگەر لوزوومم بینیبی بەعزیکم لەوانە نووسیوە • بەعزی حەدیثی بو تەقویەی رجالی حەدیثەکەی تر هیناوە ئیکتیفام بە ئەصلی حەدیثەکە کردووە تابیعەکەم نەنووسیوە ؛ چونکە دوو سی کەلیمەی لەوە ذیکر کردووە حەتا خویشی ـ اکثریا ـ تەنها رجالی تابیعەکەی ذیکر کردووە تا هاتووەتە سەر قال ابو هريرة مەسەلا لەویدا ڕاوەستاوەو چووەتە سەر حەدیثەکەی تر ••

مسلم ـ رحمه الله تعالى ورضي عنه ـ هەموو ئیسنادەکانی لە جیبەکا کوکردووەتەوە لە دوای ئەوە حەدیثەکە ینی ئەو تەرتیبە بو ئیمەمانان

سووکتره • مەسلەکی هەردووکیان ـ خوایان لی رازی بی ـ بو ئەهلی خوی زور باشه ، ئەوان نەبوونایه ئینسانی وەکو ئیمە چی پی ئەکرا ؟ ـ شکر الله سعیهم ، وارضاهم بنور جماله ، جل جلاله ـ ••

ئەوەیش بزانن بە قەدەری ئیمکان‌و طاقەتی پیری خوم هەر حەدیثی کە موناسەبەی بە بابی بیت هەمووم لەو بابەدا ذیکر کردووە ، ئەگەر موناسەبەی بە چەند بابی بیت هەر لە بابیکا ذیکرم کردووە ، بەو واسیطە عەدەدی حەدیثی « مجمع البحرين » گەیوه بەوەندە ••[1] •

فەقەط بەسەبەبی ئەوە کە شوعوورو حیفظم وەکو خوم پیر بوون ئەم « مجمع البحرين »ە بە تەواوی لە تیکرار نەجاتی نەبووە ؛ چونکە وا بووە کە لە وەختی نووسینا تووشی حەدیثی بووم لیم یەقین بووە کە ئەو حەدیثەم لەوە پیش نووسیوه ، لە بەر ئەوە کە موناسەبەتی بە پینج شەش باب بووە نازانم کە لە کامیا نەم نووسیوه موراجەعەی ئەو بابانەم کردووە لە پەنجا شەصت پەرەدا بوی گەراووم نەمدوزیوەتەوە لە ئاخریدا ماندووبووم‌و پیم‌خستووە لی‌ی وەستاوم لە بەر ئەوەیش مەبادا کە ئـەم حەدیثـە فائیدەیەکی زیادی ببی کـە لـە حەدیثەکەی پیشوودا نەبووبی دووبارە نووسیومە • شاید شتیکی وا تووش ببن رجام وایە بە خیری خوتان ئیصلاحی بکەن • یەعنی کامیان بە فائیدەتربو ئەوە بنووسن ، ئەوی تر حەزف بکەن ، ئەگەر یەك دوو کەلیمەی زیاتر بو لەوی تر

(١) دیارە لەکـاتی نووسینی ئـەم پیشەکی‌یەدا ژمارەی گشتی حەدیثەکانی نەزانیوە بویە بە « بەوەندە » وازی هینـاوە •• ژمارەی تەواوی حەدیثەکانی ئەم کتیبە « ٣٩٦٥ » حەدیثە • دیارە ئەم ژمارەیە کەمترە لە هەموو « مسلم »و « بخاری » ئەگەر دووپاتی لی لانەبردایە • م• ع• ق•

